وتاری چوارده

زنجیرە وتاری(شیرك و شیركی گوێڕایەڵی كردن)

# الشِّرْكُ وشِرْكُ الطَّاعَةِ

الديمقراطية -حرية العقيدة - "لَكُمْ دِينُكُمْ وَليِ دِين"

ديموكراسی-ئازادی بیروباوەڕ - "لَكُمْ دِينُكُمْ وَليَ دِينِ"

وتاری شیخ

أبو علي الأنباري تقبله الله

وەرگێڕانی و ئامادەكردنی

پێگەی ڕاستەڕێ




پێگەی ڕاستەڕێ

بسم الله الرحمن الرحيم

وتارى
شێخ ئەبى عەلى ئەنبارى - تقبه الله-

وتارى (چواردە)

بەناونيشانى
ديموكراسى- ئازادى بيروباوەڕ - "لَكُمْ دِينُكُمْ وَليَ دِينِ"

وەرگێڕانى
پێگەى ڕاستەڕێ



الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله

خوایە حەقمان بە حەق پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر شوێنکەوتنی، وە باتڵیشمان بە باتڵ پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر ئەوەی لێی دووربکەوینەوە، خوایە ئەوەمان فێر بکە کە سوودمان پێدەگەیەنێت و سوودمەندمان بکە بەوەی فێرمان دەکەیت، پەروەردگارا لەوانەمان بکەیت کە کار بە زانستەکەیان دەکەن، خوایە زانستەکەمان بکە بە بەڵگە و حوججە بۆمان ئەو ڕۆژەی بە دیدارت دەگەین و نەیکەیتە بەڵگە بەسەرمانەوە ئەی چاکترینی بە بەزەییان، ئەی پەروەردگارم سینەم ئاسوودە و گوشاد بکە و کاروبار و هەوڵ وکۆششم بۆ ئاسان بکە و گرێی زمانم بکەرەوە و زمانم گۆیا و پاراو بکە تا لە گوفتارم تێبگەن، پەروەردگارا کردەوەکانم چاك بکە و تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت و هیچ بەشێکی تێدا نەبێت بۆ هیچ یەکێك لە دروستکراوانت..

باسەکەمان لە وانەی ڕابردوو دەربارەی ئازادی بیروباوەڕ بوو لە دیموکراسی، وە قسەمان کرد دەربارەی ئەو دەقانەی پاڵدراوەکان بۆ لای ئیسلام بە بەڵگە دەیهێننەوە لە چەسپاندنی ئەوەی کە لە دیندا شتێك هەیە بەناوی "ئازادی بیروباوەڕ و ئازادی دینەکان"، وە وتمان دوو ئایەت دەکەنە بەڵگە لە پەڕتوکی الله عز وجل، ئایەتی یەکەم (لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ) کە ئەم ئایەتەمان تاوتوێ کرد بە وردی ولله الفضل والمنة، وە ڕوونبووەوە کە مەبەست لە ئایەتەکە تەنها خاوەن پەڕتوکەکانن بەپێی ڕێکخەرە ئیسلامییە شەرعییەکان، وە وتمان ئەم ئایەتە ناکرێت هەموو کەس بیڵێت تەنها کەسانێك نەبن کە الله عز وجل دەسەڵاتدار و پایەداری کردوون لە خاکی ئیسلام، بەڵام لە خاکی کوفر و لەژێر دیموکراسی و لەژێر حوکمی تاغوتان کەسێکی بەناو موسڵمان دێت و لەگەڵ نەسارا دەدوێت و دەڵێت (لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ) وتمان هیچ پەیوەندییێکت بەم ئایەتەوە نیە، بەڵکو ئەم ئایەتە کەسانێك دەیڵێن جیهادیان کردووە لە پێناو الله و ڕاستیان کردووە لەگەڵ الله و جا الله عز وجل دەسەڵاتداری کردوون لە زەوی، ئەوانە لە خاکی ئیسلام بە نەسارا دەڵێن (لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ).

ئەمڕۆش بە ویستی الله تعالى ئایەتی دووەم تاوتوێ دەکەین کە بانگخوازانی ئازادی بیروباوەڕ و ئازادی دینەکان لە شوێنکەوتووانی ئەفلاتون دەیکەنە بەڵگە جا پشتیوان بە الله عز وجل دەڵێم، ئایەتی دووەم لە بەڵگە هێنانەوەیان ئەم فەرموودەیەی الله تعالى ـیە (لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ) [(١)] ، مانا و واتای ئەم ئایەتە چییە، هۆکاری دابەزینی چییە، ئایا دەکرێت بە بەڵگە بهێنرێتەوە لەسەر ئەوەی لە ئیسلامدا شتێك هەبێت بەناوی ئازادی بیروباوەڕ یان ئازادی دین؟

(١) الكافرون: ٦

جا پشتیوان بە اللە عز وجل دەڵێم، لە دەستپێکدا هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە، بۆچی اللە عز وجل ئەم سوڕەتەی دابەزاند (قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ) تا (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ )، ئیبن حیببان باسی هۆکاری دابەزینەکەی کردووە، هەروەك ئیبن تەیمیە -رحمە اللە- لێی دەگێڕێتەوە لە تەفسیرەکەی و هەروەها ئیمامی بەغەوی لە تەفسیرەکەیدا هۆکاری دابەزینەکەی گواستوەتەوە، وە هەروەها (الإمام العز ابن عبد السلام -رحمە اللە-) لە تەفسیرەکەیدا هۆکاری دابەزینەکەی باسکردووە، ئەم بەڕێزانە هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتەیان باسکردووە و دەڵێن: کەسانێك لە موشریکەکانی مەککە: أمية ابن خلف، العاص بن وائل، والمطلب ابن الأسود و پیاوی چوارەمیشیان لەگەڵ بوو، هاتن بۆ لای رسول اللە (ﷺ)و وتیان: ساڵێك خوای تۆ دەپەرستین، وە تۆش ساڵێك خوای ئێمە بپەرستە، ئینجا ئەگەر خێر و چاکە لە لای تۆ بوو ئەوا بەشی خۆمان وەردەگرین لەوەی لە لای تۆیە، وە ئەگەر خێر و چاکە لە لای ئێمە بوو ئەوا بەشی خۆت وەردەگریت لەوەی لای ئێمەیە، ئەمە پوختەی قسەکانیان بوو، جا اللە عز وجل ئەمەی دابەزاند ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ٢ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ٤ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ٥ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ٦﴾[1] ئەمە هۆکاری دابەزینی ئایەتەکە بوو.

هەندێك وردەکاری پەیوەست بە ئایەتەکە هەیە، لە سەرەتادا توێژینەوە دەکەین لە بابەتی: ئایا ئەم ئایەتە مەنسوخە یان مەنسوخ نیە؟ ئەگەر مەنسوخە بەڵگە چییە، وە ئەگەر مەنسوخ نیە بەڵگە و تەفسیری ئایەتەکەش چییە؟ زانایان دابەش بوونە بۆ دوو بۆچوون، بەشێك لە زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە دەڵێن: ئەم ئایەتە مەنسوخە، وە لەو موفەسیرانەی وتویانە مەنسوخە ئیمامی قوڕتوبی ـیە -رحمە اللە- لە تەفسیرەکەیدا کە دەڵێت: "ئەم ئایەتە موحکەم بوو بەر لەوەی فەرمان بکرێت بە پێغەمبەر (ﷺ) بە جەنگکردن پاشان نەسخ بۆتەوە بە ئایەتی قیتال" ئەمە وتەی ئیمامی قوڕتوبی بوو -رحمە اللە-، هەروەها ئیبن حەزم -رحمە اللە- لە "الناسخ والمنسوخ" کە پەڕتوکێکی ئەوە، دەڵێت ئەم ئایەتە مەنسوخە بە ئایەتەکانی جیهاد یاخود ئایەتی شمشێر، هەروەها وتەیەکی (الإمام الزركشي) لە "البرهان" هەیە لەسەر ئەوەی ئەم ئایەتە مەنسوخە، هەروەها ئیمامی بەغەوی -رحمە اللە- گواستویەتیەوە لە "مقاتل"ـەوە کە ئەم ئایەتە مەنسوخە بە ئایەتەکانی جیهاد.

کەوایە ئەمە وتەی یەکەمی زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە بوو لەوانەی دەڵێن ئەم ئایەتە مەنسوخە، کە ئەمەش واتە دەقەکە دەمێنێت بەڵام حوکمەکەی کاری پێناکرێت، جا بەگوێرەی وتەی ئەوانەی دەڵێن ئایەتەکە مەنسوخە، ئەمە مانای وایە هیچ شتێك نیە ناوی ئازادی بیروباوەڕ بێت لە دین، نە

(١) الكافرون

ئازادی بیروباوەڕ و نە ئازادی دینەکان، بۆچی؟ چونکە ئەوانەی ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە لەسەر ئازادی بیروباوەڕ و ئازادی دین، هەندێك لە زانایان وتویانە ئەم ئایەتە مەنسوخە، بۆیە بەپێی ئەم وتەیە ناکرێت ئەم ئایەتە بە بەڵگە بهێنرێتەوە لەسەر ئازادی بیروباوەڕ و ئازادی دین کە کۆڵەکەیەکە لە کۆڵەکەکانی دیموکراسی، ئەمە وتەی یەکەم.

سەبارەت بە وتەکەی تری زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە، ئەوا وتویانە ئایەتەکە موحکەمە -هیچ نەسخێك لە ئایەتەکە نیە- وە بەهۆی درێژی وتەکانی زانایان لەسەر کاغەز دەیخوێنمەوە بە ویستی الله تعالى، وتەی یەکەم کە هی ئیبن قەییم ـە -رحمه الله تعالى- لە تەفسیرەکەیدا، ئایا ئایەتەکە مەنسوخە یان نا، ئیبن قەییم -رحمه الله- دەڵێت: "وە لەو سوڕەتانەیە مەحاڵە نەسخ بچێتە نێو ناوەڕۆکەکەیەوە، چونکە حوکمەکانی تەوحید کە بانگەوازی پێغەمبەران لەسەری کۆکە، مەحاڵە نەسخ بچێتە ناویەوە، وە ئەم سوڕەتەش (مەبەستی " قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ "ـە) تەوحیدی پوخت کردووەتەوە، هەر بۆیەش پێی دەوترێت سوڕەتی ئیخلاص هەروەك باسکراوە"، کەوایە ئیبن قەییم -رحمه الله- دەڵێت ئەم ئایەتە موحکەمە، چی بە بەڵگە دەهێنێتەوە لەسەر ئەوەی ئەم ئایەتە نەسخ ناچێتە ناویەوە؟ دەڵێت چونکە ئەمە لە ئایەتەکانی ئەحکامە کە بانگەوازی هەموو پێغەمبەران لەسەری کۆکە، هەموو پێغەمبەران بانگەوازی ئەوەیان کردووە ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ ٣٦﴾[1] ، واتە: بەڕاستی ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووە و پێیان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها الله بپەرستن و خۆتان دووره پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر (تاغوت). بابەتی بەڕائەت کردن لە کافران و لە موشریکەکان ئەمە لە بنچینەکانی بانگەوازی پێغەمبەرانە، دەڵێت جا هەتاکو ئەمە لە بنچینەکانی بانگەوازی پێغەمبەران بێت، کەوایە ناکرێت ئەم ئایەتە نەسخ ببێتەوە، دوای ئەوە ئیبن قەییم باسی ئەوە دەکات کە بۆچی هەندێك لە زانایان وتویانە نەسخ بۆتەوە جا دەڵێت: "وە هۆکاری هەڵەکەیان ئەوەیە وا گومانیان بردووە کە ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر داننان بە دینەکەیان، پاشان وایان بینیوە کە ئەم داننان و پەسەندکردنە بە شمشێر لاچووە بۆیە وتویانە مەنسوخە" ئیبن قەییم -رحمه الله- شی دەکاتەوە کە بۆچی زانایان وتویانە ئایەتەکە مەنسوخە، دەڵێت چونکە ئەوان وا گومانیان بردووە ئەم ئایەتە داننیاوە بە دینی کافران و موشریکەکان، (لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ) وەك ئەوەی وا تێگەیشتبن لە ئایەتەکە داننانە بە دینی کافران، پاشان کاتێك ئایەتی قیتال دابەزیوە وتویانە کەوایە ئێستا ئایەتی قیتال ئەم داننانەی لە فەرموودەی الله تعالى دا (لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ) هاتووە نەسخ

(١) النحل: ٣٦

کردۆتەوە، ڕوونە إن شاء الله.

ئەمە وتەی ئیبن قەییم و شیکردنەوەی ئەو بوو بۆ ئەو کەسەی دەڵێت ئایەتەکە موحکەم بووە پاشان نەسخ بۆتەوە، پاشان ئیبن قەییم -رحمه الله- لە هەمان پەڕتوکدا دەڵێت: "بەڵکو ئەم ئایەتە دەمێنێتەوە و موحکەمە و جێگیرە لە نێوان ئیماندااران و کافران تاوەکو الله بەندەکانی و زەوییەکەی لێیان پاك دەکاتەوە"، کەوابوو ئەم ئایەتە لە وتەی ئیبن قەییم مەنسوخ نیە و دەمێنێتەوە تاوەکو بەرپابوونی قیامەت و هەروەها جیاکەرەوەیە لە نێوان ئیمانداران و کافران، ئەمە وتەی ئیبن قەییم.

سەبارەت بە وتەی (الإمام الزركشي) لە "البرهان في علوم القرآن" دا دەڵێت: "ئەوەی زۆرێك لە موفەسیرەکان هەمیشە دەیڵێنەوە لە دەربارەی ئەو ئایەتانەی فەرمان دەکەن بە سوك و ئاسان کردن بەوەی نەسخ بوونەتەوە بە ئایەتی شمشێر ئەوە وتەیەکی لاوازە (هەندێك لەو ئایەتانەی فەرمانی کردووە بە هەندێك بابەت پاشان ئایەتەکانی قیتال هاتوون جا هەموو ئایەتێکی قیتالیان کردووەتە هۆی نەسخ بوونەوەی ئەم ئایەتانە دەڵێت ئەمە وتەیەکی لاوازە) بەڵکو لە (المنسأ)ـە، بەو واتایەی هەموو فەرمانێك هاتبێت پێویستە جێبەجێ بکرێت لە کاتێك لە کاتەکان کە ئەم حوکمە واجب دەکات، پاشان دەگوێزرێتەوە بە گوێزرانەوەی ئەم هۆکار و عیللەتە بۆ حوکمێکی تر کە نەسخ نیە"، مانای وتەی (الإمام الزركشي -رحمه الله-) چییە؟، دەڵێت هەندێك لە زانایان کاتێك ئەم سوڕەتەیان (قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ) خوێندووەتەوە پاشان ئایەتی ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْ﴾ ـیان خوێندووەتەوە، وتویانە ئەم ئایەتە ئایەتەکەی تری نەسخ کردۆتەوە، ئەویش دەڵێت نەخێر، ئەم ئایەتە موحکەمە و دەمێنێت، ئایەتەکەی تریش موحکەمە و دەمێنێت، بەڵام هەر ئایەتێك کاتێکی هەیە بۆ کارپێکردنی جا ئەگەر هۆکار و عیللەتەکە هاتەدی ئێستا کار دەکەین بە ئایەتی (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ )، وە کاتێك عیللەتەکە هاتەدی لە قیتال ئەوا کار دەکەین بە ئایەتی ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾[1] دەڵێت ئەم ئایەتە موحکەمە و کاتێکی خۆی هەیە کە ئەو کاتە کاری پێدەکەین، وە ئایەتەکەی تریش موحکەمە و کاتێکی خۆی هەیە و کاری پێدەکەین، کە پێکاویەتی لە بۆچوونەکەی بە بەڵگەی ئەوەی موسڵمانان لە هەموو کات زیاتر پێویستیان بە کارکردنە بە فەرمودەی الله عز وجل (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) بەهۆی سەرهەڵدانی ئەو دینە باتڵانە -پەنا بە الله- و ئەو حیزب و ئەو خۆدانە پاڵ ئیسلام و ئەو کۆمەڵانە، بۆیە ئەوەی لەسەر ڕێبازی ئەهلی سوننە و جەماعەیە ئێستا دەڵێت (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) کەوایە لە وڵاتانی موسڵمانان ئێستا لە خاکی ئیسلام پێویستمان بەوە نیە بیڵێین -الحمد لله- بەڵام موسڵمانان لە وڵاتانی

(١) الحج:٣٩

موسڵمانان پێویستیان بەوەیە بە "ئیخوان موسلیمین" بڵێن، بڵێن بە مورجیئە و بڵێن بە سۆفییەکان و بڵێن بە ڕافیضە، کار بکەن بەم ئایەتە و پێیان بڵێن (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) کەوابوو ئایەتەکە مەنسوخ نیە بەڵکو کاری پێدەکەین کاتێك عیللەتەکە بێتەدی لە کارپێکردن بەم ئایەتە، ئەمە وتەی (الإمام الزركشي -رحمه الله-) بوو، پاشان دوای ئەوە دەڵێت: "جا حوکمی (المسايفة) نەسخکەرەوەی حوکمی (المسالمة) نیە بەڵکو هەر یەکێکیان پێویستە جێبەجێ بکرێت لە کاتی خۆیدا"، ئایەتی (المسايفة) واتە ئەو ئایەتانەی فەرمانکردنی بە جەنگکردن تیادایە، ئایەتی (المسالمة) ئەو ئایەتانەی خوێندمانەوە (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ )، دەڵێت هەموو ئایەتێك حوکمەکەی جێبەجێ دەکەین کاتێك لە کەشوهەوای ئایەتەکە دەژین، جا پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك لە مەککە بوو و چەوساوە بوو ئەو کاتە فەرمانی پێنەکرابوو بە جەنگکردن، بەڵکو قۆناغی دەستگرتنەوە بوو ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوا أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ ﴿٧٧﴾﴾[(١)] ، واتە: ئایا نەتڕوانیوەتە ئەوانەی کە پێیان وترا: دەست بپارێزن کاتی جەنگ نیە، بەڵکو هەر نوێژ بکەن و زەکات بدەن. وە یەکێك لە صەحابەکان کاتێك داوای لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد مۆڵەت بدات بە جەنگکردن، پێی فەرموون: "فەرمانمان پێنەکراوە بەمە" (رواه ابن اسحاق والبيهقي) کەوایە ئەم ماوەیە (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) بوو، بۆیە موسڵمانان ئەگەر لە شوێنێك بوون دینی تری تیادا بوو، وە لەم شوێنەدا کۆمەڵە گومڕاکان هەبوون -پەنا بە الله- و ئەوانیش لەسەر ڕێبازی ئەهلی سوننە و جەماعە بوون، کار دەکەن بەم ئایەتە و بەوانە دەڵێن (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) ئەمەش وتەی (الإمام الزركشي -رحمه الله-) بوو.

وتەیەکی تر هەیە هی ئیبن تەیمیەیە -رحمه الله تعالى- دەڵێت: " وە ئەمەش بابەتێکی موحکەمە و نەسخ قبوڵ ناکات"، کەوایە ئێستا دوو وتەم لەبەردەستە لەبارەی ئایەتەکە، هەندێك زانا وتویانە: مەنسوخە، و هەندێکیش وتویانە: مەنسوخ نیە، ئەوانەی وتویانە ئایەتەکە مەنسوخ نیە، چۆن لێی تێگەیشتوونە؟ واتە مانای فەرموودەی الله عز وجل (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) چییە لە لای ئەم زانایانە؟ وتیان موحکەمە، کەواتە مانای ئەم ئایەتە چییە؟ وتەکانی هەندێك لە زانایانتان بۆ دەگوازمەوە لە تێگەیشتنی ئەم ئایەتە، (الإمام النيسابوري -رحمه الله-) وتەیەکی ئیبن عەباس - الله لە خۆی و باوکی ڕازی بێت- دەگوێزێتەوە، دەڵێت: "هیچ سوڕەتێك نیە لە قورئاندا زیاتر ئیبلیس توڕە و بێزار بکات لەم سوڕەتە، چونکە یەکخواپەرستی و بەڕائەت کردنە لە شیرك"، کەوایە چی تێدەگەم لە ( قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ) تاوەکو ئایەتی کۆتایی (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) ئەوەیە کە الله عز وجل بە تاك و تەنها بپەرستی، وە

(١) النساء: ٧٧

بەڕائەت بکەیت لە شیرك و لە موشریکەکان، کە ئەمە بوو ئاماژەمان پێدا کاتێك قسەمان کرد دەربارەی فەرموودەی الله عز وجل﴿ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ ﴾[(١)] .

وتەیەکی تری ئیبن تەیمیە -رحمه الله- هەیە لە "الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح" لە تەفسیری (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) دەڵێت: " (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئێوە پەیوەستن بە دینی خۆتان و هاوبەشیتان ناکەم تیایدا -بەڕائەت کردنە- وە منیش پەیوەستم بە دینی خۆم و هاوبەشیم ناکەن تیایدا"، کەوایە چۆن لێی تێگەیشت؟ بەم جۆرە لێی تێگەیشت کە ئایەتەکە ئایەتی بەڕائەت کردن و ئایەتی دابڕانە، وتەیەکی تری ئیبن تەیمیە هەیە لە (الفتاوى) دەربارەی فەرموودەی الله عز وجل (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) دەڵێت: "بەڵگەیە لەسەر بەڕائەت کردن لە دینەکەیان، هەر بۆیەش پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی ئەم سوڕەتەوە فەرمووی بەڕاستی بەڕائەت کردنە لە شیرك"[(٢)]

سەبارەت بە وتەی ئیبن قەییم -رحمه الله- بە هەمان شێوە دەڵێت: "مانای ئایەتەکە ئەوەیە یەکخواپەرستی بێتەدی و بەڕائەت کردن لە شیرك و موشریکەکان بێتەدی" -سەرنج بدە چی دەڵێت- کە ئەم قسەیە لە تەفسیری ئیبن قەییم هەیە، دەڵێت: "ئایەتەکە بەڕائەتی پوخت و بێخەوش دەردەخات هەروەك باسکرا (وەك ئەوەی ئاماژەی بەم باسە دابێت لە پێشدا) وە ئەو دینەی ئەوان لەسەرینە هەرگیز پەسەندتان ناکەین لەسەری، چونکە دینێکی باتڵە و تایبەتە بە خۆتانەوە و هاوبەشیتان ناکەین تیایدا، وە ئێوەش هاوبەشی ناکەن لە دینە حەقەکەمان، ئەمەش ئەوپەڕی بەڕائەت کردن و خۆلادانە لە پەسەندکردنیان لەبارەی دینەکەیان"، کەوایە (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) مانای چییە؟ ئەوەیە کە بەڕائەت بکەیت لەوانە و دابڕێی لێیان.

هەروەها وتەیەکی ئەبی حەییان هەیە لە تەفسیرەکەیدا "البحر المحيط" دەڵێت -رحمه الله-: "( لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) واتە شیرکی خۆتان بۆ خۆتان و تەوحیدی خۆم بۆ خۆم، ئەمەش لوتکەی بەڕائەت کردنە" کەوایە زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە وا تێگەیشتوون لە فەرموودەی الله عز وجل کە موحکەم و جێگیرە و مەنسوخ نیە، لەسەر ئەوەی بەپێی ئەم ئایەتە ئێمە بەڕائەت دەکەین لە کافران و بەڕائەت دەکەین لە موشریکەکان و لە دینەکەیان، وە کار بەم ئایەتە دەکەین کاتێك تێدەپەڕین بەو بارودۆخەی رسول الله (ﷺ) تیایدا بوو لە مەککە.

واتە لە ڕۆژگاری ڕافیضە کاتێك حوکمی ئەم وڵاتەیان دەکرد، لەسەر ئەهلی سوننە بوو بڵێین بە هەر یەك

(١) الممتحنة: ٤

(٢) فەرموودەکە ئیمامی موسلیم گێڕاویەتیەوە

لەو کۆمەڵانەی لەسەر گۆڕەپانەکە دیار بوون وەك ئەو حیزبانەی هەیە و ڕافیضە و هاوشێوەی ئەمانە، (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ).

هەروەها بەشێك لە زانایان ئەم ئایەتەیان بە هەڕەشەکردن لێك داوەتەوە وتویانە: مانای (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ) ئەمە هەڕەشەیەکە لە لایەن الله ـەوە -عز وجل- بۆ شوێنکەوتووانی ئەو دینانە و شوێنکەوتووانی ئەو کۆمەڵانە، لەوانەی ئەم قسەیەی کردووە ئیمامی ماوەردی ـیە -رحمه الله- لە تەفسیرەکەیدا "النُّكَت والعيون" دەڵێت: "ئەمەش هەڕەشەیە لەویەوە بۆ ئەوان، وە مانای ئەوەیە: وكفى بجزاء عملي ثوابا، واتە من پێتان دەڵێم من بەرییم لێتان و الله عز وجل پاداشتم دەداتەوە لەسەر ئەم قسەیەی کردوومە دەربارەتان"، بۆیە ئەمە لە لایەنی هەڕەشەکردنەوەیە بۆ ئەوانە، ئەمەش وتەی ئیمامی ماوەردی نیە بەڵکو دەڵێت: "ئیبن عیسا وتویەتی" من نازانم ئیبن عیسا کێیە، بەڵام ئیمامی ماوەردی -رحمه الله تعالى- ئەم وتەیەی داوەتە پاڵ ئەو، وە هەروەك دەزانن زانایان وتەی کەسانی تر نادەنە پاڵ خۆیان، چونکە ڕێسایەکیان هەیە دەڵێت: "لە بەرەکەتی زانست ئەوەیە بدرێتە پاڵ خاوەنەکەی".[1]وە ماناکەی وكفى بجزاء عملي ثوابا، واتە من دوژمنایەتیتان دەکەم و دەڵێم من بەرییم لێتان و بەڕائەت دەکەم لە دینەکەتان و الله عز وجل پاداشتم دەداتەوە لەسەر ئەوەی دەیڵێم دەربارەتان.

هەروەها (الإمام الرازي) لە تەفسیرەکەی باسی ئەوەی کردووە[2] جا لەبارەی ئەم ئایەتە دەڵێت: "مەبەست لێی هەڕەشەکردنە وەك ئەم فەرموودەیەی -تعالى-: (اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ) "، کەوایە ئایەتێکی موحکەمم لە لایە چۆن تێیبگەم مادام موحکەم بێت و مەنسوخ نەبێت؟ بەوەی کە یەکخواپەرستی بهێنیتە دی لە ڕێگەی ئەم سوڕەتە و بەڕائەت بکەیت لە موشریکەکان، لە هەمان کاتیشدا کارەکەت بە هەڕەشەیەك بۆیان هەژمار دەکرێت بەوەی الله عز وجل پاداشتت دەداتەوە لەسەر کارەکەت کاتێك پێیان دەڵێیت (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ)، ئەم ئایەتە دەمێنێت مادام موحکەمە، بۆیە دەمێنێت تاوەکو بەرپابوونی قیامەت، ئیبن تەیمیە -رحمه الله تعالى- لە تەفسیرەکەیدا دوای باسکردنی هۆکاری دابەزینی ئایەتەکە دەڵێت: "جا ڕووی وتەکە لە هەموو موشریکەکانە، لەوەی ڕۆیشتووە و لەوەی دێت تاوەکو ڕۆژی قیامەت" ئەمە تێگەیشتنی زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعەیە بۆ ئایەتەکە.

ئایا دەکرێت وا تێبگەین بەهۆی ئەوەی ئەم ئایەتە موحکەمە و بەڵگەیە لەسەر تەوحید و بەڕائەت کردن و هەڕەشەکردن، ئایا دەکرێت وا تێبگەین لەم ئایەتە کە لە واتاکانیدا دانان و ڕازیبوونە بە مانەوەی

---

(١) یەکێك لە قوتابیەکان پرسیاری لێدەکات دەربارەی مانای وتەی ماوەردی بەوەی هەڕەشەیە.

(٢) وەك زانراوە کە (الرازي) موعتەزیلی بوو پاشان گەڕایەوە بۆ لای الله عز وجل و تەوبەی کرد.

كافران لەسەر دینەکەیان؟ لەمەی وتم دوو وتە هەیە: وتەیەکی زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە و وتەی وەزیرێکی تەتەری، ئینجا ئایا وتەی زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە چییە و وتەی تەتەرییەکە چییە؟ وە بانگخوازانی ئەفلاتون و ئەوانەی پەسەندی دیموکراسی و ئازادی بیروباوەڕ دەکەن ئایا هاوڕان لەگەڵ وەزیرە تەتەرییەکە، یان هاوڕان لەگەڵ زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە؟

سەرنج بدە وتەکانی زانایان، ئیبن تەیمیە -رحمه الله تعالی- لە "الفرقان بین أولیاء الرحمن وأولیاء الشیطان" دەڵێت: "وە ئەمە وتەیەکە (واتە وتەی الله عز وجل -لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ- ) وە ئەمە وتەیەکە بەڕائەت کردن لە دینەکەیان پێویست دەکات و دەردەخات، وە مانای ڕازیبوونی بەمە نادات" ئەمە وتەیەك، وتەیەکی تری هەیە لە هەمان پەڕتوکدا دەڵێت -لەگەڵمدا بڕوانە-: "وە هەر یەکێك لە مولحیدەکان وا گومان ببات کە ئەمە ڕازیبوونی ئەوە (پێغەمبەر (ﷺ)) بە دینی کافران ئەوا لە درۆزنترینی خەڵکە و بێباوەڕترینیانە" ئەمە وتەی ئیبن تەیمیە بوو، وتەیەکی تری هەیە دەڵێت: "ئایەتەکە بەڕائەت کردنە لە شیرك و لە ئایەتەکەدا نەهاتووە کە ئەو ڕازی بوو بێت بە دینی موشریکەکان و خاوەن پەڕتوکەکان هەروەك هەندێك لە مولحیدەکان وا گومان دەبەن" ئەم وتەیە لە پەڕتوکی (الصَّفدية) هاتووە، ئەمەش وتەی ئیبن تەیمیە بوو، سەبارەت بە وتەی ئیبن قەییم -رحمه الله- سەرنج بدە چی دەڵێت، وتەکە کەمێك درێژە، ئەمەش بە هەمان شێوە لە تەفسیرەکەی هاتووە دەڵێت: "پەنا بە الله لەوەی ئایەتەکە هیچ داننانێك و ڕازیبوونێك بە دینەکەیان دەربخات، بەڵکو بەردەوام پێغەمبەر (ﷺ) لە سەرەتای بانگەوازەکەش کە سەخت بوو لەسەر خۆی و لەسەر هاوەڵەکانی، توندبوو لەسەر نکوڵی کردن لێیان و لەکەدارکردنی دینەکەیان و ناشرینکردنی و نەهی کردن لێی و هەڕەشەکردن و بەڵێن دان بە سزا لە هەموو کاتێك و لە هەموو شوێنێکی کۆبوونەوە، وە داوایان لێکرد وازبێنێت لە باسکردنی خواکانیان و لەکەدارکردنی دینەکەیان ئەوا وازی لێدێنن لەسەر حاڵی خۆی، بەڵام ڕەتیکردەوە و بەردەوام بوو لەسەر نکوڵی کردن لێیان و لەکەدارکردنی دینەکەیان، جا چۆن دەوترێت کە ئایەتەکە مانای ڕازیبوون و داننانی ئەو بۆیان دەدات" وتەکەی ئیبن قەییم تەواو دەکەم، دەڵێت: "پەنا بە الله لەم بۆچوونە باتڵە، بەڵکو ئایەتەکە بەڕائەتی پوخت و تەواو دەردەخات هەروەك باسکرا، وە ئەو دینەی ئێوە لەسەرینە هەرگیز پەسەندتان ناکەین لەسەری چونکە دینێکی باتڵە، بۆیە تایبەتە بە خۆتان و هاوبەشیتان ناکەین تیایدا و ئێوەش هاوبەشیمان ناکەن لە دینی حەقمان، جا ئەمەش لوتکەی بەڕائەت و خۆلادانە لە پەسەندکردنیان لەبارەی دینەکەیانەوە، جا ئایا دانان و ڕازیبوون لە کوێیە هەتا بانگەشەی ئەوە بکرێت نەسخ بۆتەوە یان تایبەتمەندە" ئەمە وتەی ئیبن قەییم -رحمه الله-، وە تەواوکەری وتەکەی دەڵێت

"مەگەر بینراوە ئەگەر جیهادیان بکرێت بە شمشێر -واتە کافران- هەروەك جیهادیان دەکرێت بە بەڵگە و ڕوونکردنەوە، دروست نیە ئەو کاتە بوترێت (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) "، واتە لە کاتی جەنگکردنمان لە دژیان ئایا دەکرێت پێیان بڵێین (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) ؟ بۆیە ئایەتەکە موحکەمە و قیتالیش بە هەمان شێوە موحکەمە.

وتەیەکی (الإمام الرازي) هەیە، وتەیەکی بەنرخە باسی کردووە لە تەفسیرەکەی دەڵێت: "جا ئەگەر بوترێت ئایا دەکرێت بوترێت ئەو مۆڵەتی کافربوونی پێداون؟ -بەپێی ئەم ئایەتە- دەڵێین: نەخێر چونکە ئەو (عليه السلام) بۆ ڕێگریکردن لە کوفر نێردراوە، جا چۆن مۆڵەت دەدات بە کوفر! "، بۆیە ئایەتەکە هیچ بەڵگەیەکی تیادا نیە لەسەر ئازادی بیروباوەڕ و ئازادی دینەکان هەروەك بانگخوازانی ئەفلاتون وا گومان دەبەن، "چونکە ئەو (عليه السلام) نێردراوە بۆ ڕێگریکردن لە کوفر جا چۆن مۆڵەت دەدات بە کوفر! "، الله عز وجل ناردوویەتی بۆ ئەوەی کوفر نەمێنێت، ئیتر چۆن مۆڵەت دەدات کوفر هەبێت ؟!

جا ئەو کەسە کێیە دەڵێت ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئازادی بیروباوەڕ و ئازادی دین؟ سەرنج بدە، ئیبن تەیمیە -رحمه الله تعالی- لە (الفتاوی الکبری) دەڵێت: "هەروەها وەزیرە گەمژەکەیان ناسراو بە "الرشید" (باسی تەتار دەکات، وەزیرێکیان هەبووە نازناوی "الرشید" بوو) هەروەها وەزیرە گەمژەکەیان ناسراو بە "الرشید" -پاشان دەڵێت- تەنانەت وەزیرەکەیان ئەم چەپەڵە مولحیدە مونافیقە نووسراوێکی نووسیوە پێکهاتووە لەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ)ڕازی بووە بە دینی جوولەکە و نەساڕا، وە نکوڵییان لێناکرێت و سەرزەنشت ناکرێن و ڕێگریان لێناکرێت لە دینەکەیان و فەرمانیان پێناکرێت بە هاتنە نێو ئیسلام، وە ئەم چەپەڵە نەفامە بەڵگەی هێناوەتەوە بەم سوڕەتە ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ① لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ② وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ③ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ④ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ⑤ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ⑥﴾ وە پێی وایە ئەم ئایەتە وا دەردەخات کە ئەو بە دینەکەیان ڕازی بووە -وە دەڵێت- ئەم ئایەتەش موحکمە و مەنسوخ نیە و بەهۆی ئەمەشەوە هەندێك شت ڕوویدا".

وتەی ئیبن تەیمیە -رحمه الله- چیبوو لەبارەی ئەو کەسەی ئەم فەرموودەیەی الله عز وجل (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) دەکاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کافران وازلێبهێنین لەوەی لەسەرینە ئازادی بیروباوەڕ و ئازادی دین؟ وتی: وەزیرێکی مولحیدی مونافیقیان هەبوو و بەو سیفەتانەش باسیکرد کە گوێت لێبوو، ئەم کابرایە پەڕتوکێکی نووسی ناوەڕۆکەکەی ئەوە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ)وازی لە جوولەکە هێناوە لەوەی لەسەرینە، وە نەساڕا و موشریکەکانیش لەوەی لەسەرینە، وە ئەم فەرموودەیەی الله تعالی (لَكُمْ دِينُكُمْ

وَلِيَ دِينِ ) كردبووی بە بەڵگە، وە وتی بەهۆی ئەم بۆچوونە هەندێك شت ڕوویدا واتە لەو ناوچانەی ئەو مولحیدە گومڕایە لێی بوو، وتەی ئیبن تەیمیە تەواو دەکەم لەبارەی ئەم وەزیرە، دەڵێت: "وە زانراو و ئاشکرایە کە ئەمە لە نەزانی ئەوە، چونکە ئەم فەرموودەیەی -تعالی- (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) ئەوەی تێدا نیە کە وا دەربخات دینی موشریکەکان حەق بێت و ڕازی بێت پێی بەڵکو بەڵگەیە لەسەر بەڕائەت کردن لە دینەکەیان هەر بۆیەش(ﷺ) لەبارەی سوڕەتەکەوە فەرموویەتی {بەڕاستی بەڕائەتە لە شیرك} "، کەوایە ئەوەی ئازادی بیروباوەڕ و دینەکانی دانا بەپێی فەرموودەی الله عز وجل (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) ئەوا ئەم تەتەرییە بوو ناسراو بە "الرشيد"، جا ئێستا بانگخوازانی ئەفلاتون لەوانەی بانگەشەی موسڵمانبوون دەکەن، کێ پێشینیانە؟ بەدڵنیاییەوە زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە نین، بەڵکو پێشینیان ئەم مولحیدە گومڕایە بوو کە ئیبن تەیمیە باسیکرد و وتی نازناوی "الرشيد" بوو، ئەمە بوو ئازادی بیروباوەڕ و دینەکانی خستەڕوو، ئەوانەی پاڵدراون بۆ لای ئیسلام لە بانگخوازانی ئەفلاتون بە هەمان شێوە باسی ئازادی بیروباوەڕ دەکەن، وە هەروەك دەزانن ئەم ئایەتە بریتییە لە لوتکەی بەڕائەت کردن لە کوفر و لە کافران.

وتەیەکی تری ئیبن تەیمیە -رحمە الله تعالی- هەیە دەربارەی ئەم بابەتە، دەڵێت -ئەمە لە (الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح)- : "جا ئەم مولحیدە وا گومانی بردووە کە ئایەتی (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) مانای ئەوەیە ئەو ڕازی بووە بە دینی کافران -پاشان دەڵێت- کە ئەمەش لە ئاشکراترین درۆ و قسە هەڵبەستنە بۆ محمد (ﷺ) چونکە ئەو هەرگیز ڕازی نەبووە تەنها بە دینی الله نەبێت کە پێغەمبەرانی پێناردووە و پەڕتوکەکانی پێدابەزاندووە، هەرگیز بە دینی کافران ڕازی نەبووە نە لە موشریکەکان و نە لە خاوەن پەڕتوکەکان" ئەمە وتەی ئیبن تەیمیە بوو -رحمە الله-.

وتەی سێیەمی ئیبن تەیمیە هەیە لە (الفتاوى الكبرى)، وەك خۆگونجاندنێك لەگەڵ ئەو کەسانە لەسەر ئەوەی (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) مانای ئەوە بێت شوێنکەوتووانی دینەکان دەمێننەوە لەسەر دینەکەیان، سەرنج بدە چی دەڵێت، دەڵێت: "ئەگەر وا دانرا کە لەم سوڕەتەدا ئەوە دەردەخات ئەوان فەرمانیان پێنەکراوە لەسەر وازهێنان لە دینەکەیان، بەڵام بە پێویستییەوە زانراوە لە دینی ئیسلام بە دەقە متواترەکان و بە کۆڕای ئوممەت کە ئەو فەرمانی کردووە بە موشریکەکان و خاوەن پەڕتوکەکان باوەڕی پێبهێنن، وە ئەو لەسەر ئەمە بۆیان هاتووە و هەواڵی پێداون کە ئەوان کافرن و بە نەمری دەمێننەوە لە ئاگر"، جا ئەمە لە ڕووی خۆگونجاندنەوە لەگەڵیان ئیبن تەیمیە دەیڵێت، وتی ئەگەر وامان دانا کە (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) مانای ئەوەیە وازتان لێدێنین بەوەی لەسەر دینەکەتان بمێننەوە بەپێی ئەم ئایەتە، وتی: چەندین

ئايەتی متواتر و دەقی متواتر هەيە فەرمان دەكات بە وازنـەهێنان لەوانە لەسەر دينەكەيان، بەڵكو فەرمان دەكات بە جەنگكرديان و هەواڵ پێدانيان بەوەی ئەوان كافرن، وە ئەوان بە نەمری لە ئاگری دۆزەخدا دەمێننەوە، بۆيە تەنها لەم ئايەتە كورت ناكەينەوە لە نكوڵی كردن و ڕەتكردنەوەی ئازادی بيروباوەڕ و ئازادی دينەكان، بەڵكو بڕێكی گەورە لەو ئايەتانە هەيە كە فەرمان دەكەن بە جەنگكردن لەگەڵ ئەوانە، و بە هەواڵ پێدانيان بەوەی كافرن و ئەگەريش بمرن لەسەر دينەكەيان ئەوا بە نەمری دەمێننەوە لە ئاگری دۆزەخ، ڕوونە إن شاء الله، الحمد لله.

يەكێك لە قوتابيەكان پرسيار دەكات: واتە شێخ ئەوەمان دەست دەكەوێت كە ئەم ئايەتە مەنسوخ نيە؟، دەڵێت: موحكەمە، قوتابيەكە: وە ئايەتەكانی قيتاليش موحكەمە.

شێخ: وە ئايەتەكانی قيتال موحكەمە و ئەم ئايەتەش نابێتە بەڵگە لەسەر دانان بە دينەكەيان، بەڵكو كار دەكەی بەم ئايەتە لەو بارودۆخانەی تيايدا چەوساوەيت و هاوكات كۆمەڵە باتڵەكان و گومڕاكان و دينە گومڕاييەكان هەيە، لەو كاتە لەسەر ئەهلی سوننە پێويستە بەوانە بڵێن (لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ) وە لە سەردەمی بەعسييەكان ئەوەی لەسەر ڕێبازی ئەهلی سوننە و جەماعە بوو بە هەر يەكێك لەو كۆمەڵانەيان دەوت: بە ڕافيضە بە سۆفييەكان بە بەعسييەكان و بە كۆمەڵەكانی تريش دەيانوت (لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ).

دێينە سەر بابەتێكی تر كە پەيوەستە بە تەوەرەكە، فەرموودەی الله تعالى (لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ) و فەرموودەی الله تعالى (لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ) بەدڵنياييەوە ئەم ئايەتانە دابەزينە سەر رسول الله (ﷺ)، جا ئايا بە شوێنكەوتووانی دينێك لە دينەكانی وتوە ئێوە بمێننەوە لەسەر دينەكەتان لەوەی لەسەرينە بەبێ ئەوەی ڕێكبخرێن بە ڕێكخەرەكانی شەرع وەك خاوەن پەڕتوكەكان؟ يان ئايا بە موشريكەكانی مەككەی وتوە بمێننەوە لەسەر دينەكەتان تاكو كۆچی دوايی كرد؟ بەدڵنياييەوە نەخێر، كاتێك كۆچی كرد بۆ مەدينە، وە الله عز وجل مۆڵەتی دا بە جەنگكردن، پێغەمبەر (ﷺ) لەناو ئەم شارە بوو كە دەورە درابوو بە سێ دين: دينی موشريكەكان لە جەزيرەی عەرەبی، وە دينی نەساڕا لە باكووری جەزيرە، وە دينی مەجوس لە ڕۆژهەڵاتی جەزيرە، ئەم ئايەتانەش دابەزيە سەری، جا ئايا بە موشريكەكانی جەزيرەی وت (لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ) و وازی لێهێنان لەسەر دينەكەيان بمێننەوە؟ بەدڵنياييەوە نەخێر، بە بەڵگەی ئەوەی دوای ئەوەی مۆڵەتی درا بە جەنگكردن ئيتر جەنگی لەگەڵ كردن، وە گەيشتە ساڵی چوارەم كاتێك غەزوەی ئەحزاب ڕوويدا و الله تعالى ئيماندارانی پاراست لە خراپە و زيانی جەنگ،

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (الآن نغزوهم ولا يغزوننا) [١]، گەیشتە ساڵی شەشەم لە کۆچی و کافران بێدەسەڵات و لاوازبوون و تای ئیمان بەهێز و بەرز دەبووەوە، ئینجا ئاشتەوایی حودەیبیە ڕوویدا، وە ئاشتەواییەکە مانای داننان بە مانەوەیان لەسەر دینەکەیان نەبوو بەڵکو ماوەیەکی وازلێهێنان بوو، پێیان دەوتن ئێوە موشریکن و لە داهاتووشدا بە نەمری دەمێننەوە لە ئاگر، بەڵام چوونە نێو ماوەیەکی ئاگربەست و ئاشتەوایی کردن، کاتێکیش قوڕەیش پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوە لە نێوان خۆیان و پێغەمبەر (ﷺ)، هێرشی کردنە سەر و الله عز وجل مەککەی بۆ فەتح کرد و بە گۆچان بە دەستی پیرۆزی ئەو بتانەی دەشکاند و دەیفەرموو ﴿وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا ۝٨١﴾[٢]"[٣]. بۆیە بۆیە دەیوت ئەمە باتڵە و هەروەها لایدەبرد، کەوایە کارەکەی لە کوێی فەرموودەی الله ـیە -عز وجل- (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) ؟، مەگەر ئەم ئایەتە دانەبەزیوە کاتێك لە مەککە بوو و ئاڕاستە کرابوو بۆ موشریکەکانی مەککە؟ ئەی بۆچی وازی لێنەهێنان هەروەك بانگخوازانی دیموکراسی و ئازادی بیروباوەڕ و شوێنکەوتووانی ئەفلاتون وا گومان دەبەن؟ کەوایە ئەمە دینی موشریکەکان بوو، لە باکووری شارەکە دینی نەساڕا بوو، لە سەرەتادا سوپایەکی نارد بۆیان بە سەرکرایەتی "زید بن حارثة" جا گەیشتنە ناوچەی (مؤتة) ئینجا جەنگەکە لەوێ ڕوویدا و جەنگان لەگەڵ ڕۆم، وە ژمارەی صەحابە لەو جەنگەدا سێ هەزار صەحابی بوو، بەڵام ژمارەی سەربازانی ڕۆم دوو سەد هەزار ڕۆمی بوو، واتە هەر صەحابەیەك دەجەنگا لەگەڵ پەنجا تاکو شەست پیاو لەوان، وا گومانیش نەبەن بابەتەکە تفەنگ و هاویشتن و تەقاندن بێت لە دوورەوە، نەخێر بە شمشێر بوو لە دووری مەترێك یەکێکیان لەگەڵ ئەوی تر دەجەنگا، الله عز وجل بۆ خالیدی ڕەخساند کە بتوانێت لەگەڵ موسڵمانان بکشێنەوە و بگەڕێنەوە مەدینە، ئایا دەزانی کە خەڵکی مەدینە بەردیان تێدەگرتن، وتیان هەڵاتووەکان هەڵاتن لە پێناو الله، وە هیچ یەکێکیان نەیدەتوانی بگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی تەنها دوای ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: من لە دەستەی ئەوانم ئەوان هەڵاتوو نین بەڵکو دووبارەکەرەوەن (کرارون) و منیش لە دەستەی ئەوانم، ئەو کاتە خەڵکی مەدینە وازیان لێهێنان، دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) پەیامێکی نارد بۆ قەیسەر پاشای ڕۆم، فەرموودەکە فەرموودەناسەکان باسیان کردووە و فەرموودەکەش صەحیحە (رواه البخاري)، دەقی پەیامەکە: "بسم الله الرحمن الرحيم، من محمد عبد الله إلى هرقل عظيم الروم، السلام على من اتبع

---

(١) فەرموودەکە ئیمامی أحمد گێڕاویەتیەوە و "شعيب الأرناؤوط" دەڵێت فەرموودەکە صەحیحە.

(٢) الإسراء: ٨١.

(٣) متفق عليه.

الهدى، أدعوك بدعاية الإسلام أسلم تسلم يؤتك الله أجرك مرتين ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا ﴿٦٤﴾﴾ [١] فإن توليت فإن عليك إثم الأريسيين"، {واتە: بسم الله الرحمن الرحيم، لە محمد بەندەی الله بۆ هیرەقل گەورەی ڕۆم، سەلام لەسەر ئەو کەسە بێت کە شوێنی هیدایەت دەکەوێت، بانگت دەکەم بە بانگەوازی ئیسلام موسڵمان ببە الله تعالی دووجار پاداشتت دەداتەوە، (واتای ئایەتەکە) : ئەی محمد(ﷺ)بڵێ: ئەی ئەوانەی کتێبتان بۆ ڕەوانە کراوە وەرن بەدەم بانگەواز و بەرنامەیەکەوە کە هاوبەش و هاوسەنگە لە نێوان ئێمە و ئێوەشدا کە : جگە لە (الله) کەسی تر نەپەرستین، هیچ جۆرە هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەین. جا ئەگەر پشتی تێبکەیت ئەوا گوناهی ئەریسییەکان لەسەرت دەکەوێت}، جا بانگەوازەکە گەیشتە ڕۆم.

وە لە ڕووی ئاماژەپێکردنەوە دەڵێم: پێویستە بەراوردێك بکەی لە نێوان ئەم نامەیە و نامەی (إبراهيم نعمة) بۆ گەورەکەی "جۆن"ـی بەڕێز لە لای ئەو! وە نامەکەی شێخ ئوسامەت لەبیر بێت -داواکارین لە الله تعالی لێی قبوڵ بکات- بۆ ئۆباما: "لە ئوسامەوە بۆ ئۆباما سەلام لەسەر ئەو کەسەی شوێنی هیدایەت دەکەوێت، ئەگەر نامەکانمان بە وشەکان پێتان گەیشتبا بە فڕۆکەکان نەماندەنارد"، بەراورد بکە لە نێوان ئەم نامانە و نامەکانی ئەوانە و کێشەیەکیش نیە بگەڕێیتەوە بۆ نامەکانی "عائض القرني" و بگەڕێیتەوە بۆ نامەی "سفر الحوالي" و بگەڕێیتەوە بۆ نامەی "حسن البنا" و بۆ نامەی فڵان تاوەکو بزانیت ئەوانە لە کوێی ئیسلامن کاتێك تاغوتەکان دەدوێنن.

کەوایە بانگەوازەکە گەیشتە ڕۆم، پێغەمبەر (ﷺ)لە ساڵی نۆیەم دەرچوو و هێرشی کردنە سەر، گەیشتە تەبوك پاشان گەڕایەوە و هیچ جەنگێك ڕوونەدا، کەوایە ئەو بەمەبەستی جەنگکردنیان ڕۆیشت کە دەشزانێت الله تعالی ئایەتی (لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ) دابەزاندووەتە سەری و ئایەتی (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ) دابەزاندووەتە سەری، جا ئەم جەنگانە و ئەم دەرچوونە و ئەم پەیامە، چۆن دەیگونجێنی لەگەڵ تێگەیشتنی ئەوانە بۆ ئەم دوو ئایەتە، دوای ئەوە صەحابە -ڕەزای الله تعالی لە هەموویان بێت- لەسەر ڕێبازی رسول الله(ﷺ)بوون، ئیمامی ئەبو بەکر دوای ئەوەی بووە خەلیفەی موسڵمانان، کۆمەڵەیەك لە سوپاکانی نارد، لە چوارچێوەی ئەو سوپایانەش سوپایەك ڕووی کردە وڵاتی شام بۆ جەنگکردن لەگەڵ ڕۆم کە نەسارا بوون، وە ئاگاداری فەرموودەی الله تعالی (لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ) بوو، وە ئاگاداری فەرموودەی الله تعالی (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ) بوو، بۆیە تێگەیشتنی رسول الله(ﷺ)و تێگەیشتنی صەحابە

(١) آل عمران: ٦٤.

یەکناگرێتەوە لەگەڵ تێگەیشتنی ئەوانە، ئەوانە لە دۆڵێکن و دینیش لە دۆڵێکی ترە، جا نە پێغەمبەر (ﷺ)وازی لە نەسارا هێنا و نە صەحابە وازیان لێهێنانن، بەڵکو زۆریان لێکردن و جیهادیان کردن تاوەکو ڕۆمیان لادا لە دەسەڵات لە وڵاتی شام، جا وای لێهات کەسی شامی لەو کاتەدا یان موسڵمان دەبوو یان ملکەچ دەبوو بۆ (الشروط العُمرية) بە سەرانە دان، کەوابوو کاری صەحابە لە کوێی تێگەیشتنی ئەوانەیە بۆ ئەم ئایەتە.

هەروەها سەبارەت بە مەجوس، پێغەمبەر(ﷺ)نامەیەکی نارد بۆ کیسڕا -گەورەی فارسەکان- : "بسم الله الرحمن الرحيم، من محمد عبد الله إلى كسرى عظيم الفرس –أيضا دعاه فيه إلى الله عز وجل– واعلم أني رسول الله إلى الناس كافة –ثم بعد ذلك– فان أبيت فان عليك إثم المجوس"، واتە: بسم الله الرحمن الرحيم، لە محمد بەندەی الله بۆ کیسڕا گەورەی فارسەکان (تیایدا بانگی دەکات بۆ لای الله عز وجل)، وە بزانە من نێردراوی الله ـم بۆ هەموو خەڵك (پاشان دوای ئەوە) جا ئەگەر ڕەتی بکەیتەوە ئەوا گوناهی مەجوست لەسەر دەکەوێت. ئەو گێڕانەوەیەی هاتووە لە لای بوخاری -رحمه الله تعالى- دەڵێت نامەکەی پێغەمبەری(ﷺ)دڕاند ئەویش دوعای لێکرد بەوەی الله تعالى موڵك و دەسەڵاتەکەی لەناوببات.

تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ)درێژ نەبووەوە بۆ ئەوەی بجەنگێت لەگەڵ ئەوانە، الله تعالى ئەمەی ویست، بەڵام صەحابە وەك درێژەپێدانێك بە ڕێبازی رسول الله (ﷺ) سوپاکانیان نارد و لە پێشەکی ئەوانەی ناردیان، ئیمامی ئەبو بەکر (رضي الله عنه)کاتێك سەعدی (رضي الله عنه)نارد بۆ جەنگکردن لەگەڵ فارسەکان، وە وازیان لێنەهێنان تاکو وایان لێکردن دەستبەرداری دینەکەیان بین و دەستیانگرت بەسەر سامانیان و ئەوانیش هاتنە نێو ئیسلام، ئایا صەحابە نەیاندەزانی لە پەڕتوکی الله عز وجل ئایەتێك هەیە دەفەرموێت (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) ؟ نەیاندەزانی (لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ) هەیە؟ جا چۆن تێگەیشتن لەم ئایەتانە و چۆن ڕەفتاریان کردووە لەگەڵ ئەم ئایەتانە؟ بۆیە وازیان لە موشریکەکان نەهێنا لەسەر دینەکەیان بمێننەوە و وازیان لە نەسارا نەهێنا لەسەر دینەکەیان و وازیان لە مەجوس نەهێنا لەسەر دینەکەیان بمێننەوە، وە بەڵگەیەکی تر ئەوەیە کە درێژبوونەوەی ئیسلام لە غانا تا فرغانا تەنها بە لابردنی کافران و لابردنی هێزەکانیان بووە، وە ناچارکردنیان لەسەر هاتنە نێو ئیسلام بەدرێژایی مێژوو، هەرچەندە دەیانزانی لە پەڕتوکی الله ئەم دوو ئایەتە هەیە.

کەوایە ئەمە تێگەیشتنێکی پوچە، پێشینیەکەشیان ئەم وەزیرە تەتەرییە بوو کە ئیبن تەیمیە لەبارەیەوە ئەوەی وتی، وە پێشینیان بە هیچ جۆرێك پەیوەندییان بە هیچ زانایەك نیە لە زاناکانی ئەهلی سوننە،

بەڵكو هيچ پەيوەندييەكيان نيە بە تێگەيشتنى زانايانى ئەهلى سوننە و جەماعە بۆ ئايەتەكە، وە بە كارى پێغەمبەر (ﷺ) و كارى صەحابە.

وە دەڵێم: بيرت نەچێت كە دينى ئيسلام دينێكى نەسخكەرەوەيە بۆ دينەكانى پێشوو، جا ئەگەر بڵێين (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ) ئەمە واتە دينەكان هەموويان بمێنن!، ئەمەش دژى ئەوەيە كە زانينى بە پێويست دانراوە لە دينەكەمان، ئەوەى كە ئيسلام نەسخكەرەوەى دينەكانى پێشووە، الله تعالى دەفەرموێت ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾﴾ [١] ، واتە: جا ئەوەى بێجگە لە دينى ئيسلام پەيڕەوى هەر دينێكى تر بكات لێى وەرناگيرێت، لە قيامەتيشدا لە خەسارەتمەند و زەرەرمەندانە.

سەبارەت بە جوولەكەش ئەوا پێغەمبەر (ﷺ) لێينەگەڕان لەسەر دينەكەيان بەڵكو لە مەدينە دەريكردن و لە كاتى مردنى فەرمووى: "جوولەكە دەربكەن لە جەزيرەى عەرەب" وە بە هەمان شێوە فەرموويەتى: "خاوەن پەڕتوكەكان دەربكەن لە جەزيرەى عەرەب"، ئەمە وتەى پێغەمبەرمانە و ئەمەش كارەكانيەتى، بەڵام ئەوەى لە دواى ئەو هاتن وەك نموونەى كۆيلەكانى ئەمريكا ئەوانە ئەمريكييەكانيان هێنايە جەزيرەى عەرەب، وە زانايانى گومڕاييش فەتواى دروستبوونى ئەم كارەيان بۆ دان بەوەى وەلى ئەمر ئەوانەى هێناوە، تەنانەت گوێم لە هەندێكيان بووە وتويەتى ئەوان خاوەن پەيمانن بە پەيمانى ئەمير هاتوون! ، ئەى كابرا خاوەن پەيمانەكان فڕۆكەكانيان موسڵمانان بۆردومان دەكەن؟! ئەى كوا سەرانەكە؟! مادام خاوەن پەيمان بن دەبێت سەرانە بدەن،

أقول قولي هذا وأستغفر الله لي لكم وجزاكم الله خيرا

**وتارى**
**شێخ ئەبى عەلى ئەنبارى** - تقبه الله-

**وەرگێرانى و ئامادەكردنى**
**پێگەى ڕاستەڕێ**




(١) آل عمران: ٨٥